هەستا بە چاودێری کردنی داد و سەربەستی و بە خوێنی پاکی شەهیدان ئاوی دا و بەروبوومی زۆری لێ کەوتەوە، لە مێژوودا پێشکەوتنێکی گەورە بەدی هات لە هەموو بوارەکانی ڕۆشنبیری و فیکر و هۆشدا.

بەردەوام شارستانیەتی قەرزارباری صدیق (ﷺ)ە، چونکە بە جیهادە جوانەکەی و هۆش و بینابیە مەزنەکەیەوە توانی ئاینی ئیسلام لە ناو گەل و هۆز و وڵاتاندا بڵاو بکاتەوە بە هۆی ئەو جەنگە ڕزگاریخوازیە مەزنانەوە.

٦٣- ئەم هەوڵە کەمەی من کە جێگەی ڕەخنە و پێشنیاری هەموو لایەکە، تەنها هەوڵێك بووە بۆ دەرخستنی ڕاستی سەردەمی خەلافەتی ڕاشید، تا بەردەوام سوود لەو بزوتنەوە مەزنە وەربگرین لە هەڵنانی هەنگاوەکانی بەردەوامماندا بۆ جێگیر کردنی حوکمی خوا لەسەر زەوی و بڵاو کردنەوەی ئاینەکەی لە ناو خەڵکدا و بە ڕەخنە گرانیشم دەڵێم وەك شاعیر دەڵێت:

ان تجد عیباً فسد خللا جلّ من لا عیب فیه و علا

واتا: ئەگەر عەیب و ناتەواویەکت بینی، تۆ تەواوی بکە، بەرزی و بڵندی بۆ ئەو خوایەی ناتەواوی نیە.

داواکارم لە خوای مەزن، پەروەردگاری عەرشی ڕێزدار، کە ئەم کارەم لێ قبووڵ بفەرمووێت و پیرۆزی بکات و بیخاتە ڕێزی کردەوە چاکەکانم تا لێوەی نزیك ببمەوە و منیش و هەموو ئەو برایانەی کە هاوکاریان کردم لە نووسینی ئەم ژیاننامەیەدا بێبەش نەکات لە پاداشت و هاوڕێیەتی ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان.

ئەم کتێبە کۆتایی پێ دێنم بە ئایەتێکی پیرۆزی قورئانەکەی پەروەردگارم کە دەفەرمووێت:

﴿رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ۝١٠﴾ (الحشر: ١٠).

(سبحانك اللهم وبحمدك أشهد ان لا اله الا انت أستغفرك وأتوب اليك واخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين).

# ناوەڕۆك

چاوەڕوانی سەرجەم بەرهەمەکانی دوکتۆر محمد علی الصلابی بن کە هەموویان لە ئامادەکاری دان بۆ لەچاپدانیان بە ڕەزامەندی خودی جەنابی دکتۆر محمد علی الصلابی کە ئەمانەی خوارەوەیان بەم زووانە دەکەونە بەر دەستتان بە پشتیوانی خوای گەورە

١-ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ)

٢- عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه)

٣-عوسمانی کوڕی عەففان(رضي الله عنه)

٤-عەلی کوڕی ئەبوو تالیب (رضي الله عنه)

٥-حەسەنی کوڕی عەلی(رضي الله عنه)

٦- عومەری کوڕی عەبدولعەزیز(رضي الله عنه)

شایانی باسە کتێبی صلاح الدینی ئەیووبی پێش بلاوکردنەوەی بە زمانی عەرەبی وێنیەکیمان وەرگرتووە ، لە لایەن دوکتۆرەوە بە مەبەستی وەرگێڕانی .

**بۆ هەر پێشنیارو ڕەخنەیەك تکایە پەیوەندی بکە بەم ناونیشانەوە**

کتێبخانەی نارین –هەولێر – بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی – باڵەخانەی سەید بەهائەددین – نهۆمی خوارەوە

پۆستی ئەلیکترۆنی nareen_١@yahoo.com

یاخود ژمارە مۆبایل ٠٧٥٠٤٠٦٤٦١٠